# فەرهەنگی زاراوە

زاراوەگەلی ڕاگەیاندن و کارگێڕی و قوتابخانەیی

# فەرهەنگی زاراوە

زاراوەگەلی ڕاگەیاندن و کارگێڕی و قوتابخانەیی

**عەرەبی ـ کوردی**

**بەدران ئەحمەد حەبیب**

ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری کوردستان

پێداچوونەوە و تەتەڵەکردنی

ئەندامانی کارای کۆڕ

**رەشید فندی　　د. محەمەد نوری عارف**

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردستان

هەولێر ۲۰۰۲

ـ ناوی کتێب: فەرهەنگی زاراوە
ـ دانانی: بەدران ئەحمەد حەبیب
ـ لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردستان
ـ پیت لێدان و ڕاستکردنەوە و دەرهێنانی هونەری: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
ـ خۆشنووسیی بەرگ: هونەرمەند محەمەد زادە
ـ دەرهێنانی هونەریی بەرگ: شکار عەففان نەقشبەندی
ـ تیرێژ: ٢٠٠٠ دانە
ـ چاپی یەکەم – چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان
ـ ژمارەی سپاردن بە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری لە هەولێر: ١٨٠/٢٠٠٢

# پێشەکی

ئەمڕۆ هەموو ئەو زمانانەی شان بەشانی پێشکەوتنەکانی ژیان هەنگاو دەنێن و ڕۆژانە پەرەسەندن بەخۆوە دەبینن، زاراوە بووە بەبڕبڕەی پشتیان. زمانی سەردەم، لە بوارگەلی جیاوازی زانستە مرۆڤایەتی و زانستە ڕووتەکاندا پشت بەزاراوەی نوێ دەبەستن. گەشەکردنی زمان لە بوارە جۆراوجۆرەکانی زانست و کۆمەڵناسیدا، هێندە بەرفرەوان بووە بەڕادەیەک کە زمانەکە خۆی وەکو درەخت لک و پۆپی بەملا و بەولادا هاوێشتووە و، لەهەر بوارێکدا وەک زمانێکی جیا و سەربەخۆ لە چوارچیوەی زمانە بنەڕەتییەکەدا خۆی دەنوێنێ. ئەگەر سەرنج بدەین، دەبینین بوارگەلی وەک ئەندازیاری و تەکنیکاری و بایۆلۆجی و کۆمەڵناسی و چەندان بواری تر، لە چوارچێوەی یەک زماندا زمانی سەربەخۆیان لەڕووی زاراوەوە بۆ دروست بووە. بەکورتی و پوختی دەتوانین بڵێین، ئەو گەشە و پەرەسەندنانەی لەسەرجەم ژیانی کۆمەڵایەتی و تەکنیک و زانستە ڕووتەکاندا هاتوونەتە کایە، لە پێشکەوتن و گەشەی زمانیشدا بەدەریان داوەتەوە. زمانانی هاوسەردەم، شان بەشانی پێشکەوتنی ژیان، ڕۆژانە زاراوەی تازە دەزێن. یاسای زمانە کە پێشکەوتن و پەرەسەندنی ژیان لەهەر قۆناغێکدا، زمانی تازە لەگەڵ خۆیدا دەهێنن.

هەرچەندە زمانی ئاخاوتنی کوردی، زمانێکی دەوڵەمەندە بەوشە و ئیدیۆم و دەربڕین، هەروەها جیاوازیی ئاخاوتن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر (واتە: دیالەکتە زۆر و زەوەندەکانی زمانی کوردی) وایان کردووە کە زمانێکی دەوڵەمەندمان هەبێ و، فەرهەنگی کوردی (بۆ نموونە: هەنبانە بۆرینەی هەژار و کوردستانی گیوی موکریانی زیاتر لە ٦٠ هەزار وشەیان گرتووەتەخۆ)، بەڵام زمانەکەمان لە زۆربەی بوارەکاندا زمانی کۆمەڵگەیەکی کشتوکاڵی و خێڵەکییە و، پێشکەوتنەکانی کۆمەڵگەی هاوسەردەم لە زمانی کوردیدا بەتەواوی رەنگیان نەداوەتەوە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆ. یەکەمیان: دواکەوتنی کۆمەڵگەی کوردەواری و سەرهەڵنەدانی ژیانی هاوسەردەم و شارستانی لە کوردستاندا کە پیشکەوتنی زمانیش لەگەڵ خۆیاندا بهێنن، دووەمیش: نەبوونی دەرفەت بۆ پێشوەچوونی بزووتنەوەی خوێندەواری بەزمانی کوردی چ لە ناوەخۆی کوردستان و چ لە دەرەوەیدا. بۆیە ئەگەر زمانەکەمان بەراورد بکرێت لەگەڵ زمانانی جیهانیدا، دەبینین هێشتا لە تەمەنی پێرەوکەیی و ساواییدایە. پسپۆڕ و وەرگێڕی کورد ئەگەربێو زمانی بیانیش بەباشی بزانن و باڵادەست بن تیایاندا، ناتوانن دەست بۆ وەرگێڕانی بەرهەمی هزریی هاوسەردەم یان زانستێک لە زانستەکان ببەن و، لە یەکەمین هەنگاودا ڕووبەڕووی دەسکورتی و هەژاریی زمانی کوردی لە بواری (زاراوە و زاراوەسازی)دا دەبنەوە.

دوای ڕێککەوتنی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ وەک یەکێک لە دەسکەوتەکانی شۆڕشی مەزنی ئەیلوول بەڕێبەرایەتیی بارزانیی نەمر، دەرفەت و دەلیڤەیەکی گونجاو بۆ پێشکەوتنی زمانی کوردی هاتەپێش. کۆڕی زانیاری کورد و بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی خوێندنی کوردی و یەکێتیی نووسەرانی کورد و چەندان داوودەزگای تری خوێندن و کولتووری دامەزران کە هەریەکەیان لەشوێنی خۆیەوە ڕۆڵێکی بەرچاوی لە بەرەپێدانی زمانی کوردیدا بینی. بەتایبەتیش بەکوردیکردنی دوازدە قۆناغەکەی خوێندن کە هەنگاوێکی

گەورەبوو و، شیاویی زمانی کوردیی بۆ نووسینەوەی زانستە جۆراوجۆرەکان خستە ڕوو. کۆڕی زانیاری کورد لە ساڵەکانی دەسپێکی کارکردنیدا چەند هەنگاوێکی گرینگی لە بواری دانانی زاراوەی کوردی لە گەلێک بوارەکانی زانست و کۆمەڵایەتیدا گێڕا. گیروگرفتی گەورەی کۆڕی زانیاری ئەوەبوو کە بڕیارەکانی، لە پرسی (زاراوە و ڕێنووس)دا لەلایەن داوودەزگاکانی ترەوە جێبەجێ نەکران و تەنیا بۆ کۆڕ خۆی بوو، ئەمەش لەبەرئەوەی کۆڕ دەسەڵاتێکی دڵسۆزی لە پشتەوە نەبوو کە بڕیارکانی ببن بەفەرمانی بێ چەند و چۆن و، هەموو لایەک لەسەری بڕۆن. تا سەرەنجام، دوای دەست پێکردنەوەی شەڕ لە نێوان شۆڕشی کورد و حکوومەتی ناوەندی لە ١٩٧٤دا وردە وردە جێگە بەکارەکانی کۆڕ و دواجار بەدەزگاکە خۆیشی لێژ بوو.

هەروەها لە دوای ساڵانی هەشتاوە وەرگێڕانی پرۆگرامی قوتابخانەکان بەکەسانی نەشارەزا لە زمانی کوردی سپێردران و، بەڕێوەبەرایەتیی خویندنی کوردی لە بەغدا لە دوای ئەو ڕۆڵە گرینگەی لەدوای ڕێککەوتنی ١١ی ئاداردا گێڕای، وردەوردە کەوتە پاشەکشە. ئێستا پرۆگرامی قوتابخانەکان – ئەوانەی لە بەغدا چاپ دەکرێن – چ لە رووی دارشتنی زمان و چ لە رووی زاراوە بەکارهاتووەکانەوە، زۆر دەسکورت و هەژارن و ئەمەش کاریگەرییەکی نالەباری کردووەتە سەر ڕەوتی فێرکردن.

لە دوای ڕاپەڕینەوە بزووتنەوەی خوێندەواری و ڕووناکبیری لە کوردستانی عێراقدا بەرەوتێکی خێرا ملی ڕێگەی بەرەوپێش گرتووە. ڕۆژانە چەندین بڵاوکراوە دەردەچن. چەندین داوودەزگای ڕاگەیاندن و کولتووری و زانستی، بەرهەم بڵاودەکەنەوە. ئەمە سەرەڕای خوێندنی زمانی کوردی لە تەواوی قۆناغەکانی خوێندن و بەکارهێنانی زمانی کوردی لە فەرمانگەکانی حکوومەتی هەرێمدا. هەروەها لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان و لە پارچەکانی تریشدا بڵاوکراوە و دەزگای خوێندن و کولتووری دامەزراون و بەرهەمیان هەیە. ئەمە سەردەمێکی تازە و گرینگە بۆ پەرەسەندنی زمانی کوردی، بەڵام نەبوونی دەزگایەکی سانسۆر یان چاودێریکەر لە رووی سەلامەتیی زمانی کوردییەوە بووەتە هۆی ئەوەی کە زۆر دیاردەی نالەبار لە نووسین و زاراوەسازیی کوردیدا سەرهەڵبدەن.

ئەرکی کۆڕی زانیاری کوردستانە بڕیاردەری هەموو ئەو پرسانەبێت کە پێوەندییان بەزمانی کوردییەوە هەیە بەتایبەتیش زاراوە کە وەک گوتمان بڕبڕەی پشتی زمانی نووسینی سەردەمە. وێڕای ئەمەش یەکێک لە هەنگاوەکانی کۆڕ بەرێگەی دروستبوونی زمانی کوردیدا، هەنگاوهاوێشتنە بەرەو یەکخستنی ئەو زاراوانەی بەکاردێن، هەروەها دانانی فەرهەنگی زاراوە بۆ بوارە جیاوازەکان.

وەک سەرنج دەدرێ، ئەوانەی لە بوارەکانی ڕۆشنبیری و و ڕاگەیاندنی کوردیدا کار دەکەن، بەهۆی نەبوونی زاراوەی پێویست لەبەردەستیاندا، هەندێک جار بەناچاری پەنا بۆ داتاشین و دروستکردن دەبەن کە ڕەنگە هەموو جار تیایدا سەرکەوتوو نەبن. زۆرجاریش پەنا بۆ بەکارهێنانی زاراوەی بیانی دەبەن کە هەندێکیان بۆ خوینەری کورد زۆر نامۆن و پاشاگەردانییەک لە نووسینی کوردیدا دروست دەکەن. ڕاستە بەکارهێنانی زاراوەی بیانی لەهەر زمانێکدا کارێکی ئاساییە بەتایبەتیش کە هەندێک زاراوە مۆرکێکی نێونەتەوایەتییان وەرگرتووە وەک: ئۆتۆمۆبێل، تەلەفۆن، بایۆلۆجی، ماتماتیک، بودجە، پەرلەمان،

فیستیڤاڵ، یۆبیل، هتد... بەڵام وەرگرتنی هەموو زاراوەیەک یان ژمارەیەکی زۆر زاراوە، لە ئەنجامدا دەبێ بەهۆی لەدەستدانی سەربەخۆیی زمانەکەمان، هەروەها تێگەیشتن لە بابەت بۆ خوێنەری کورد دژوار دەکەن. دانان و ڕۆنان و داتشینی زاراوە کاریکی ئاسان یان سەرپێیی نییە تا هەر کەسە و دەستی بۆ ببات، بەڵام وەک گوتمان بووە بەکارێکی ناچاری بۆ ئەوانەی لە بوارگەلی ڕاگەیاندن و هزر و ڕۆشنبیریدا کاردەکەن.

بۆ ئەوەی سانسۆری کاری زاراوەسازی بکرێت، پێویستە ئەوانەی لەم بوارەدا کار دەکەن وێڕای ئەوەی لەزمانی کوردیدا شارەزا بن و زانیارییان لەبارەی دیالەکتە جیاوازەکانی کوردییەوە هەبێ. هەروەها دەبێ ئاگەداری ئەو بوارانە بن کە زاراوەی بۆ دادەنێن و، تاقیکردنەوەی گەلانی تریشیان لە بواری زاراوە داناندا لەبەرچاوبێ.

ئێستە یەکێک لە ئەرکە بەپەلە و گرینگەکانی کۆڕی زانیاری کوردستان هەنگاونانە بەم ڕێگەیەدا. بەر لەهەموو شت دەبێ کۆڕ ڕێبازگە و ڕێوشوێنێکی زانستی دابنێ بۆ زاراوەسازی. دانانی ڕێوشوونێکی زانستییانە بۆ ڕۆژی ئەمڕۆ ئەرکێکی بەپەلەیە، تاوەکو هەموو ئەوانەی لە دەرەوەی کۆڕیش لە بواری زاراوەسازی و نووسین و وەرگێڕانی بەرهەمی زانستی و هزریدا کاردەکەن لەسەر ئەم ڕێوشوونانە بڕۆن یان سوودیان لێ وەرگرن. لەوانەیە هەموو ئەوانەی لە بواری زانستە جۆراوجۆرەکاندا کاردەکەن چاوەڕوانی کۆڕی زانیاری نەبن زاراوەیان بۆ دابنێ، دوورنییە کۆڕ خۆیشی فریانەکەوێ باڵ بکێشێ بەسەر هەموو بوارەکاندا.

***

(زاراوە: Term) لەگەڵ گەشەکردنی زمان و پەلوپۆ لێ بوونەوەی زانستەکاندا گەشە دەکات. بۆ نموونە وشەیەکی وەک (پوختە) لە کوردیدا واتەی (ڕێکوپێک: منتظم) دەگەینێ، (خواردنی پوختە، ماڵی پوختە، کاری پوختە، نەخت بێ و پوخت بێ نەک زۆر و بۆر بێ– قسەی نەستەقە)، لە فۆلکلۆردا هاتووە: (دەترسم بەختی ناپوختم وابێ + میراتی مەجنوون بۆ من جی مابێ)، بەڵام (پوختە) لە زمانی نوێدا بەواتەی (کورتە: خلاصة، نبذة) دێت، وەک: پوختەی بابەتەکە. واتە وشەی (پوختە) لە وشەیەکی فەرهەنگییەوە بووە بە زاراوەیەکی هاوچەرخ. وشەی (سەرکۆمار) لە زمانی کوردیدا سەرۆکی ئەو خێڵە گەورەیە دەگەینێ کە هەر هۆز و تیرەیەکی سەرۆکی خۆیان هەیە، واتە سەرکۆمار سەرۆکی گشتیی خێڵ دەگەینێ، ئێستە سەرکۆمار وەک زاراوە (رئیس الجمهورية) دەگرێتەوە. وەک چۆن (تەوەرە) یەکێکە لە ئامێرەکانی (ئاش) و لەزەمانی هاوسەردەمدا بووە (محور)، یان (تان و پۆ) کە داو و ڕایەڵی ئەستوونی و ئاسۆیین لە تەونکاریدا و، لەبەکارهێنانی زانستیدا بوونەتە (ئۆردینێتی س و ص).

لێرەدا دەتوانین بەکورتی سەرچاوەکانی زاراوەسازیی کوردی دەست نیشان بکەین:

**یەکەم**: وەرگرتنی وشەی فەرهەنگی، کە ئەمەیان یەکەمین هەنگاوی زاراوەسازییە. زمانی کوردی وەک هەر زمانێکی دەوڵەمەند، هەزاران بگرە دەیان هەزار وشەی لە نێوان دووتوێی فەرهەنگەکانیدا هەڵگرتووە کە بەسەرچوونی کات و گۆڕانی سیستەمی ژیان دەبێ بەهۆی فەوتان و لەکارکەوتنی هەندێک

لەو وشانە. یەکێک لە ئەرکەکانی لێژنەی زاراوەسازی ئەوەیە کە ئەم وشانە بەزیندوویی بهێڵێتەوە و بەرگێکی هاوسەردەمی بکات بەبەردا و، بۆ واتای هاوسەردەم بەکاریان بهێنێ.

جگە لە نموونەکانی (پوختە و سەرکۆمار و تەوەرە و تان و پۆ) دەتوانین بەسەدان نموونە بهێنینەوە کە ڕۆژانە لە زمانی نووسینی کوردیدا بەکاردێن و واتەیەکی تازەی جیا لە واتە کۆنە کانیان دەدەن، بۆ نموونە زاراوەی (دەرماڵە) کە لە بنەڕەتدا (ئەو برە تووتنە زیادەیە دەگەیێنێ کە دوای تەواوبوونی کار دەدرێت بەپاڵەکانی تووتنەوانی) یان لە هەندێک ناوچەی تری کوردستاندا بەو برە خۆراکە دەگوترێ کە لە ماڵەوە دەدرێت بە مەڕ و ماڵات لەو وەرزانەدا کە لەوەڕی دەرەوە تێریان ناکات. ئێستە (دەرماڵە) بۆ (مخصصات الموظفين) بەکار دەهێنرێت. (چین و توێژ) لە زمانی ئاخاوتنی کوردیدا بۆ واتای (طبقة و شريحة)ی کۆمەڵایەتی بەکارنەهاتوون و، ئەمانە واتای تازەن بۆ وشە فەرهەنگییە کۆنەکان. ئێمە لەم فەرهەنگەدا (زیندەماڵ و مردەماڵ)مان وەک زاراوەیەکی یاسایی بۆ (اموال منقولة و غير منقولة) بەکارهێناوە کە ئەم دوو زاراوەیە لە ئاخاوتنی خەڵکی گونددا، یەکەمیان بۆ سەروەت و سامانی وەک (مەڕوماڵات) و دووەمیان بۆ سامانی وەک (زەوی و خانووبەرە) بەکارهاتووە، واتەکەی ئێرەیان لەبەرامبەر (اموال منقولة و غير منقولة))دا نیزیکییەکی هەیە لەگەڵ واتا کۆنەکەدا.

**دووەم**: ئەو زاراوانەی کە لە زمانانی بیانییەوە وەریان دەگرین، وەک لە پێشەوە نموونەی (ئۆتۆمۆبێل، تەلەفۆن، بایۆلۆجی، ماتماتیک، بودجە، پەرلەمان، فیستیڤاڵ، ئۆتۆماتیک، یۆبیل، هتد...)مان هێنایەوە. ئەم وشانە وەک گوتمان لە زۆربەی زمانانداا بەکاردێن. هەروەها لە تەواوی زانستە جۆراوجۆرەکاندا وشە و دەربڕینی تایبەت هەبن کە لە شوێنی سەرهەڵدان و پێشکەوتنی زانستەکاندا پەیدا دەبن و خۆیان بەسەر زمانانی تردا دەسەپێنن. هەر بوارێکی زانست سەیر بکەین دەیان نموونەی لەم جۆرە زاراوانەمان دەست دەکەوێ کە هەندێکیان ناون بۆ دۆزراوە تازەکان وەک: کۆمپیوتەر، سی دی، رادیۆ، تەلەفزیۆن و هتد.... بەکارهێنانی زاراوەگەلی بیانی لە زمانی کوردیدا وەک هەر زمانێکی تر کارێکی ئاساییە و نابێ لێی بترسین یان سڵ لە بەکارهێنانیان بکەینەوە بەمەرجێک دەرگا نەخرێتە سەر گازی پشت بۆ هەرچییەک هەیە، ئەمە پەشێوییەک دروست دەکات بۆ فێربوون و تێگەیشتنی خەڵک.

**سێیەم**: شێوازی ڕۆنان یان داتاشینی زاراوە. واتە: داتاشین و ڕۆنانی زاراوە لەسەر بناخە و بنەڕەتی یاساکانی وشەسازی لە زمانی کوردیدا. ئەمە گرینگترین شێوازەکانی زاراوەسازییە لەبەرئەوەی پێشکەوتنەکانی زانست و تەکنیک و کۆمەڵایەتی زۆر خێران و ڕۆژانە زاراوەی نوێمان پێویست دەبێ کە دەبێ فریایان کەوین و زاراوەی تازەیان بۆ دابتاشین. لێرەدا ئەرکی زمانەوانان دەست پێ دەکات کە دەبێ ڕێوشوونی زاراوەسازی و بنکە و یاسای بۆ داڕێژن. کتێبی قوتابخانەکان: فیزیا، بیرکاری، کیمیا، زیندەوەرزانی و رووەکناسی پڕن لە زاراوەی ئەم بابەتانە کە زۆربەی زۆریان بەشێوەیەکی زانایانە داڕێژراون و بەشێکیشیان پێداچوونەوەیان پێویستە.

لێرەدا حەز دەکەم ئاماژە بەبەرهەمێکی گرینگی مامۆستا مەسعود محەمەد بدەم لەم بوارەدا کە بەرهەمێکی ڕچەشکێنە، ئەویش (زاراوەسازیی پێوانە)یە، وەک ئاگەداریم هەبێ تا ئێستە تاکە

بەرهەمێکی زانستییە لەبواری زاراوەسازیی کوردیدا.

***

لە مانگی نیسانی ساڵی ٢٠٠١ کۆڕی زانیاری کوردستان مامۆستا رەشید فندی- جێگری سەرۆکی کۆڕ و منی راسپارد بۆ گەلاڵەکردنی فەرهەنگێکی زاراوەیی کە برێتی بێ لە پێداچوونەوە و تەتەڵە و بژارەکردنی ئەو کارانەی پێشتر کراون.

لە سەرەتادا من دەستم کرد بەکارەکە و بۆ ئەمەش چەند نامیلکەکەی کۆڕی زانیاری کورد- بەغدا و، بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی خوێندنی کوردیی دوای ساڵانی ١٩٧٠م بەکار هێنا و زیاتریش لایەنی کارگێڕی و راگەیاندن و بەشێک لەو زاراوانەم دەسبژێر کرد کە لە کتێبی قوتابخانەکاندا بەکار دێن. ئەم کارانەی کۆڕی جاران و خوێندنی کوردی، سەرەڕای لایەنی باش و پەسندیان، کەموکوڕی و هەڵەی زۆریان تیدا هەبوون کە دەبوو راست بکرێنەوە. ئێمە بەپێی دەسەڵات و شیاوپمان هەوڵمان داوە تەتەڵە و راستکردنەوەیان تێدا بکەین و ئەوانەی بەباشمان زانیون وەرمان گرتوون و ئەوەش کە بەلامانەوە چەوت بوون، بەگوێرەی بۆچوونی خۆمان راستمان کردوونەتەوە. لە راستیدا ئەو کارانەی پێشوو، بۆ کاتی خۆیان زۆر گرینک و بەبایەخ بوون و دەبێ نرخیان بۆ دابنێین.

هەروەها من لەلایەنی خۆمەوە سەدان زاراوەی ترم خستە پاڵ ئەم کارەوە کە هەندێکیان ماوەیەکە لە راگەیاندن و رۆشنبیریی کوردیدا چەسپیون و جێگەی خۆیان کردووەتەوە، هەروەها سەدان زاراوەی تریش کە من پێشنیازم کردوون و تەنیا لەم فەرهەنگەدا بەرچاو دەکەون. دوای لێ بوونەوەم لە کارەکە مامۆستا رەشید فندی پێیداچووەوە و لەهەر شوێنێک ویستبێتی زاراوەی گونجا و پەسندی لە دیالەکتی کرمانجیی سەروو خستووەتەپاڵ. هەروەها د. محەمەد نوری عارف ئەرکی پێداچوونەوەی ئەم کارەی کێشا و لە گەلێک شوێندا تێبینی و سەرنجی بەجێی بۆ نووسیبووم. سوپاسی هەردوو بەرێز دەکەم.

راستی و ناڕاستیی ئەم کارەی ئێمە، بۆ بۆچوونی جیاواز و راستکردنەوەی شارەزایان و تێکڕای رۆشنبیران بەجی دەهێڵین و، هیوادارین هەموو لایەک بەچاوێکی بەرپرسیارانە و برایانەوە لێمانی وەربگرن و کەموکورتی و هەڵەکانمان راست بکەنەوە و بیخەنە روو. هەڵبەتە هیچ کارێک بێ گرێ و کەموکورتی نابێ.

بەدران ئەحمەد حەبیب

١٤ ئادار ٢٠٠٢

## أ

ائتلاف: تەبایی، *تەڤایی*
ائتمان: باوەڕداری
أب: باوک، باڤ، *باب*
- اباً عن جد: له باووباپیرەوه
الآباء (الاجداد): باووباپیر
ابادة: قەلاچۆ، لناڤبرن، فەوتاندن، دوابڕینەوە، قڕکردن، ژ *ناڤبرن*
- أسلحة الإبادة الجماعية: چەکی دوابڕەوەی بەکۆمەڵ
ابتداء: دەست پێ کردن، دەسپێک
ابتدائي: بەرایی، سەرەتایی
ابتسامة: زەردەخەنه، *بشکوژین*، بزە، خەندە، زەردەکەنی، *گرنژین*
ابتعاد: دوور کەوتنەوە، *دوورکەفتن*
الابتلاع: هەڵلووشین، *داعویران*
الابجدية: ئەلفوبێ، ئابێ
أبداً: هەرگیز، هیچ جارێک
ابداع: داهێنان، بەدەوکاری، ئەفراندن
أبدي: هەتا هەتایی، هەمیشەیی
إبرة: دەرزی
إبرة الحياكة: شیشکه
إبرة العقرب: چزووی دووپشک
إبري (نبات): دەرزیلەیی
الابريسم: ئاوریشم، ئارمووش، هەڤریشم، *ئاڤرمووش*
الابريق: مەسینه، *مەسین*
الابصار: بینین
الابط: بن هەنگڵ، بن باڵ، *بن کەش*، *بن کەفش*
إبقاء: هێشتنەوە
الابكاء: هێنانەگرین، گریاندن

الابل: حوشتر، وشتر، حێشتر
ابلاغ: پێ ڕاگەیاندن
الأبلق: بەڵەک
ابن ج- أبناء: ڕۆڵه (کوڕ)
- ابناء المنطقة: ڕۆڵەی ناوچه
إبن آوی: چەقەڵ، تۆری، توورگ
الابهام: پەنجەکەڵه، پەنجەگەورە، *تلیا بەرانی*
الأبهة: کەشوفش، شکۆ، گەورەیی، مەزنی
ایواء: داڵدەدان، *بنەجهکرن*
الابوان: دێباب، *دەییات*
ابو بريص: (مارمێلکه) شەوگەرد، چەپ *چەپیسک*
أبو جنيب: قرژاڵ، *کێڤژاله*
أبو ملعقة: (باڵنده) دەنووک کەوچک ، دم *کەفچک*
ابو منجل: دەمەداس، داس دەنووک، دم *داس*
أبيّ: کۆڵنەدەر
أتاوة: سەرانه، هەسته
الإتباع: پەیڕەوی کردن، بەدواداچوون، *دویف چوون*
أتباع: دەستوپێ، پێڕەوکار، دەستوپێوەند
إتجاه: ئاراسته، ڕووەو، بەرەو، ڕووکار
اتجاهي: ئاراستەیی، ڕووکاری
إتحاد: یەکەتی، یەکگرتن، *هەڤگرتن*
الاتحاد -للتعاون: یەکبوون
- اتحاد القوی: یەکەتیی هێزگەل
- اتحاد المجموعات: یەکگرتنی کۆمەڵان
إتزان - توازن: هاوسەنگی، *هەڤسەنگی*
إتصال: پێک گەیشتن، پێوەندی پێ کردن، ڕاگەیێنی
- وسائل الإتصال: ئامێری ڕاگەیێنی

الاتضاح: ڕوون بوونەوە
اتفاق: ڕێککەوتن، پێکهاتن، ڕێککەفتن
اتفاقیة (معاهدة): پەیمان
إتقاد: کـڵـپـە کـردن، گـڵـپـە کـردن، داگـیـرسـان، هەڵایسان، هەلبوون
اتکال: پشت پێ بەستن
اتلاف: فەوتاندن، لەناوبردن، ڕزاندن، ژ ناڤبرن
الاتمام: تەواو کردن، تەڤاڤ کرن
أتوقع – أتوسم: ڕادەبینم، پێم وایە، وادەزانم، لام وایە
أثاث: شتومەک، شمەک، کەلوپەل
الأثاث –المنزلیة: کەلوپەلی ناوماڵ
آثار–مخلفات: شوێنەوار، جێماو
الآثار القـدیمة: شـوێنەواری کـۆنینە، کـۆنەوار، شوینواریت کەڤن
– عالم الآثار القدیمة: کۆنەناس، شوێنەوارناس
– علم الآثار القدیمة: کۆنەناسی، شوێنەوارناسی
آثار قانونیة: شوێنەواری یاسایی
إثارة: ورووژاندن، دنەدان
إثبات: سەلماندن، چەسپاندن، بەڵگە
اثر: شوێنکار، شوێن، شۆپ، شوێن پێ، جێ پێ
أثر (تأریخي): جێماو، پاشماوە
الأثرة: خۆکامی
أثل (نبات): گەز، دارگەز
اجازة: وچان، مۆڵەت
الاجازة الاعتـیـادیة: وچانی ئاسـایی، دەسـتووری ئاسایی
الاجازة الدراسیة: وچانی خوێندن
الاجازة المرضیة: وچانی نەخۆشی
اجازة (رخصة عمل): ڕێ پێ دان، مۆڵەت
الاجاص: هەڵووژە، هەڵووچکە

الاجبار: بەزۆری
اجترار: کاوێژ
اجتماع: کۆبوونەوە، جڤین
الاجتهاد (في الدین): بیرنیشاندان
الاجتهاد– (في الدرس): کۆششکاری
اجداد: باپیران
الاجذم: گول، خۆرە، گوری
الآجر، القرمید: کەرپووچ، خشتی سوور، کەلپووچ
الاجر (الثواب والمکافأة): پاداش
أجر (اجرة): کرێ، مز
الاجر الآجل: کرێی دواخراو، بەرمز
الاجر العاجل: کرێی بەرخراو، پاشمز
الاجراءات: کارڕایی، تەقەڵلا
اجراء القیاس: ئەندازەگرتن، پێوانە
اجرب: گەڕ، گول، گوری
الاجرة الاسبوعیة: کرێی هەفتانە، حەوتووانە
اجـرة الاعـمـال الیـدویة: دەسـمـز، دەسـتکر، لە (دەست کرێ)وە
الاجرة السنویة: کرێی ساڵانە، دەستکری ساڵانە
الاجـرة الـشـهـریة: کـرێی مـانگانە، دەسـتکری مانگانە
الاجرة الدوریة: کرێی وەرزانە، دەستکری وەرزانە
الاجرة الیومیة: کرێی ڕۆژانە، دەستکری ڕۆژانە
الأجل: وادەی مردن، مەودا
الاجل الاخیر: دوا مەودا
أجل غیر مسمی: مەودایەکی نادیار
الاجمة: قامیشەڵان، ژاژەڵان، دەحل
اجنبي: بێگانە، بیانی
اجهاد: ماندووکردن، وەستاندن، ئەرک کێشان
اجهزة – جهاز: دەزگا، دەزگەه
أجهزة اطفاء الحریق: دەزگاگەلی ئاگرکوژێنی

اجهزة (جسم الانسان): كۆئەندام
أجهزة دقيقة: وردەواڵە، وردە دەزگا
اجوف، مجوف: بۆش، کلۆر، ڤالا
الأجير: کرێگرتە، *کرێپاڵە*، *کرێکار*
أحابيل: فێڵ و تەڵەکە، فڕوفێڵ
الآحاد: یەکان
إحالة على التقاعد: خانەنیش کردن
أحبار (حبر): زانای ئایینیی جوولەکە
أحبولة: داونانەوە، *داڤ دانان*
احتجاج: بیانووگری، بێزاری دەربڕین
الاحتراف: پیشەوەری
احتراق: سووتان، *سووتن*
الاحتراق الداخلي: سووتانی ناوەکی، *سووتنا ژنافدا*
احتراق ذاتي: سووتانی خۆیەتی، *سووتنا خۆیەتی*
إحترام: ڕێزگرتن، نەوازی
– الإحترام المتبادل: ڕێز لەیەکتر گری، ڕێز لەیەکترگرتن
احترام حقوق الانسان: ڕێز لە مافی مرۆڤ گرتن
احتساب: لێکدانەوە
احتقار: بێزاندن. لە کوردیدا دەگوترێ: «دنیام لەبەر دەبێزێ».
احتقان: تێزان
احتكار: پاوان کردن
احتكار التجارة: پاوانکردنی بازرگانی
الاحتكاك (المادي): لەیەک خشان
الاحتكاك (المعنوي): لێک هەڵسووان
احتلال: داگیرکاری
احتمالات: ئەگەر، شیمانە
الاحتياط: یەدەک، سپێر
احتياطات: قایمەکاری، سپێرکاری

الاحجار البركانية: بەردی ئاگرپژێن، گڕکانەبەرد، *ڤولکانە بەر*
الاحجار الكريمة: بەردی گرانبا، بەردی بەنرخ، *بەرێت گرانبها*
أحد: یەکێک
أحداث– وقائع: ڕووداو، پێشهات
الاحداث– حدث: هەراش
الاحداث السيني: رایەڵ، تان
الاحداث الصادي: پۆ
أحد عشر: یازدە
الاحراج: لەڕوو دامان، سەغڵەتی
الاحراش: دەوەنجاڕ، دەوەن، بێشەڵان، تەڕاش
احراقية: سووتەمەنی، ئاردوو، ئاگردوو
إحساس: هەست
احسن الأعمال: شاکار
أحشاء: هەناو، *هناڤ*
احصاء: ئەژمار، *هژمار*
الاحصاء: سەرژمێری
الاحصاء العام: سەرژمێری گشتی
احضار: ئامادەکرن
احضان: هامێز، باوەش
الاحفاد (جيل، نسل): نەوە، نەڤی، نەڤی چرک
احلال: جێگرتنەوە، خستنەجێ، داهێورین
– إحلال السلام: داهێورینی ئاشتی
الإحلال: بۆ (حەلاڵ و حەرام) ڕەوادیتن، ڕەوابینین
أحمر: سوور
الاحمر الفاتح: سووری کاڵ
الاحمر الغامق: سووری تێر، *سوورێ تاری*
الاحوال المدنية: باری شارستانەتی، *بارێ باژێرڤانی*
الإحياء: زیندووکردنەوە

أحياء: زيندەوەر
- علم الاحياء: زيندەوەرزانى
أحياء دقيقة: زيندەوەرى وردە، وردە زيندەوەر
احياء (للحيوانات): زيندەک
احياء (للنباتات): ڕووەک
الاخاء (الاخوة): برايى، برايەتى
الإختباء: خۆشاردنەوە، خۆڤەشارتن، خۆ مات کردن
اختبار: ئەزموون
اختراع: داهێنان، ئەفراندن، بەدەوکارى
اختراق: سمين، پێداچوون
إختراق حاجز الصوت: سمينى ناوبڕەى دەنگ
اختزال: کورتکردنەوە
اختصار: پوختەکردن
اختصاص: پسپۆڕى
اختصاصي: پسپۆڕ
اختفاء: ون بوون، خۆشاردنەوە
اختلاف: جيايى، جياوازى
الاختلاف في الرأي: جياوازى لە بۆچووندا
الاختلال: لاسەنگى، شێوان
إختناق: خنکان
أخدود ج-اخاديد: کەندڕ، کەندەک، زەندۆڵ، ئاودڕ، قەڵشتى زەوى
الاخدود: لۆچ، قەڵشت، *کەلشت*
آخذ: وەرگر
- الاخذ بنظر الاعتبار: ڕەچاوکردن، بەهەند هەڵگرتن
- اخذت الاستمرارية: بينى گرت، *بەردەوامى کر*
اخراج (تمثيل): دەرهێنان، دەرئانين
اخراج (گمرگي): دەرهاويشتن
اخصاب: چاککردن، بەبرشت هێنان، بەپيت کردن، *پيتاندن*
اخضاع: هێنانەژێربار
اخضر: کەسک، سەوز
اخطار: ترس نيشاندان
الاخطار النهائي: ترس نيشاندانى دواجارە
اخطبوط: هەشت پەلە، *هەشت پێ، ئەختەپووت*
اخفاء: شاردنەوە، ڤەشارتن
إخلاء: چۆڵ کردن، بەتاڵ کردن
إخلاص: دڵسۆزى، خەمخۆرى
اخلاف: هەڵدانەوە، ڕووانەوە
الاخلاف- الاحفاد: نەوە، نەڤى، نەويرە
أخلاق: ئاکار، ڕەوشت، *سنج*
- الأخلاق السامية: ڕەوشتى بەرز
إخماد: کوژاندنەوە، دامرکاندنەوە، ڤەمراندن
أخوة: برايەتى
أخيراً: ئيتر، ئيدى
أداء: بەجێهێنان، ئەرک بەجێ هێنان، *بجهـ ئينان*
آداب: نەريت، تۆرە
الآداب العامة: نەريتى گشتى، نەريتى هەمووەکى، *تۆرێ گشتى*
آداب المائدة: نەريتى مێز، *تورێ سەرمێزێ*
أداة- للعمل: ئامێر، *ئامير*
أداة (في النحو): ئامراز
اداة العطف: ئامرازى لێکدەر
أداة الجر (التعليق): ئامرازى پێوەندى
اداة النداء: ئامرازى بانگ، ئامرازێ گازى
اداة التعريف: ئامرازى پێناسين
الادارة: کارگێڕى
- قسم الادارة: بەشى کارگێڕى
- الإدارة الذاتية: خۆبەڕێوەبردن، خۆهەڵسووڕاندن، خۆبەڕێوەبەريەتى

- الادارة المحلية: كارگێڕیی خۆجێیەتی، *کارگێڕیا خۆجهی*
- مـديرية الادارة والذاتيـة: بەڕێوەبەرایەتیی كارگێڕی و خۆیەتی
الاداري: كارگێڕ
ادامة: بەردەوامیدان
أدب: وێژە، تۆرە
الادب الشعبي: وێژەی گەلێری، وێژەی میللی
أديب: وێژەوان، تۆرەڤان
ادخار: پاشەكەوت كردن
ادخال: داكردن
ادخال مخزني: داكردنی كۆگەیی
ادراك: پێزانین، هەست پێ كردن، پێ حەسیان، تێ گەیشتن
الادغال: تەڕاش، بێشەلانی چڕ
أدوات (للعمل): ئامێر، كەلوپەل، كەرستە
الادوات المنزلية: كەلوپەلی ناوماڵ
الادوات الاحتياطية: ئامێری سپێر، *ئەمرازێ یەدەک*
الادماء: خوێن پژان
الادماع: فرمێسكین
الأدمة: بن توێژ، بن توێک
أدنى: ئەمپەڕ، نێزیكتر
أدوار ج-دور: سووڕ، خول، گەڕ
اذا: ئەگەر
اذاً: كەوابوو، كەواتە
إذابة: تواندنەوە
اذاعة: بلاڤكردن، بلاوكردن
أذن: گوێ، گوهـ
الاذى- الاذية: ئازار، ئێش
إرادة: ڤیان، ویست، خواست
إرادي: ویستە، خۆویست، ڤیانی
- لاأرادي: نەویستە، خۆنەویست
الاراضي المالحة: زەویی شۆرەكات، زەویی خوێڵێن، شۆرستان
أراضي متموجة: زورگ، زورگەلان، هەڵەت، زەویی گردەلان
الارباع -ربوع: چوار نكاڵ
أربطة: پێوەست، بەندیوەر
الاربطة الضاغطة: پێوەستی شەتەكدەر
الارتباط (تماسك): پێوەستی، بەندیواری
ارتجالي: سەرپێیی
الارتخاء: خاوبوونەوە، سستی، شل بوون
ارتخاء(نتلة): ڕاچلكاندن
الارتزاق: كاسەلێسی، جاشایەتی
ارتداد: بادانەوە، هەڵگەڕانەوە
ارتطام: هەڵنگفتن، هەڵنگوتن
ارتعاب: تۆقین
ارتعاد: ڕاتەكاندن، ڕاتەكین، موچڕكە
ارتفاع: بەرزی، بڵندی
الارتفاع الحسابي: بەرزیی ژمێرەیی
الارتفاع العملي: بەرزیی كرداری
ارتكاز: خۆڕاگیردن، لەسەر وەستان، ڕاگیربوون
إرث: جێماوە، پاشماوە، كەلەپوور
الأرج، الأريج: بەرامە
أرجاء: سەرانسەر، سەرتاسەر
أرجواني: ئەرخەوانی
الأرجوحة: هەلۆرک، جۆلانە
أرزاق: ئازووخە، *ئازوقە*
إرساء: لەنگەرگرتن، لەنگەر هاویشتن
الارشاد: ڕێ بەدێیی، ڕێبەری، ڕێ پێشاندەری
ارصاد: ڕوانین

أرض: زەوی، هەرد
الارض البكر: کۆدە، بەیار
الارض الرخوة: زەویی سستەک، زەویی فشەڵ، زەویی رفۆک
الارض الزراعية: کێڵگە، زەویی کشتوکاڵی
الارض الزراعية المتروكة: بوور
ارض طينية: بان
ارض متموجة (تلول): زوورگ، زوورگەڵان
ارض محروثة: شۆو، شۆڤ
ارض ملحية (مالحة): زەویی خوێڵێن، زەویی شۆرەکات
أرض يابسة: زەویی وشکێن، وشکە زەوی
الارض التي لاتنبت- جرداء: سۆرک
الارض قليلة الخصب (غير مزروعة): ڕووتەن
أرضة: مۆرانە
أرضية: زەوینە
الارضية (اجرة الارض): زەویانە
أرق: خەوزڕان، خەوڤەڕەڤین، بێ خەوی
أركيولوجي: شوێنەوارناسی
اركيولوجيست (عالم الآثار): شوێنەوارناس
الارنب: کەروێشک، کەڤرۆشک
ارهاب: تۆقاندن، تیرۆر
الارهاب: تیرۆریزم
الارهابي: تیرۆریست
الارهاق: کەشەنگی، شەکەتی
إرواء- اسقاء: ئاودان، داشتن، ئاودێری، ئاڤدان
الارومة (الاصل): بنەماڵە
الأريكة: تەختە
ازاحة، زحزحة: لابردن، لادان
الأزار: پەشتەماڵ
ازالة، ازاحة: لابردن، نەهێلان
- إزالة العقبات: لابردنی ڕێ پێ نەدەران
ازدحام: ئاپۆڕە، هەزارەزیلە، جەنجاڵ
الازدراد: لووشدان، لرفدان
الازدهار: گەشانەوە، گەشەسەندن
الإزدواجية: دووسەرەیی، دوولانەیی
ازرار: قۆپچە، بشکۆک، دوگمە
ازعاج: جاڕس کردن، هەراسان کردن، وەڕس کردن
أزلي- خالد: هەرهەیە، هەمیشەیی
أزمة: تەنگژە
الازمة الاقتصادية: تەنگژەی ئابووری
- أزمة خانقة: تەنگژەی بەربینگر
الازميل: ئەسکەنە
أزهار الماوي: وەنەوشە
ازياء: جلوبەرگ، پۆشاک
أزيد: پتر، زیاتر، زۆرتر
أزيز: کزەکز، گیزە
آس: مۆرد، مورتک
الاساءة: بۆسۆکردن، بەدناوکردن، ناوزڕاندن
أساس: بناخە، هیم، بنیات
الأساس (المصدر): بنج و بنەوان، بنچینە، بنەڕەت
اسباب: هۆ
الاسباب المباشرة: هۆی ڕاستەوخۆ
الاسباب غير المباشرة: هۆی ناڕاستەوخۆ
الاسبست: نەسووتە، ئەسپێست
أسبوع: هەفتە
أسبوعي: هەفتەنامە، هەفتەیی، هەفتانە
استاذ: پرۆفێسۆر
استئثار: خۆپەسەندی
الأستئجار: بەکرێ گرتن
الاستئصال: ڕیشەکێش کردن، بنەبڕکردن، لە

ریشەکەندن
الاستئناف: دەست پێ کردنەوە، تێ هەڵچوونەوە
الاستبداد: ملهوڕی، زۆرکاری، بێدادی
استبدال: جێگۆڕکێ
الاستبقاء: گلدانەوە، هێشتنەوە
الاستثمار: وەبەرهێنان
الاستثناء: هەڵاوێردن، هاوێرکردن، دەرهاویشتن
إستثنائي: بەدەر، هاوێردە
– الظروف الاستثنائية: هەلومەرجی هاوێردە
– باستثناء: بێجگەلە، بەدەر، هاوێر لە، ژ *بلی*
الاستجابة: بەدەنگەوەچوون، وەڵامدانەوە
استجابة الشكوى: گازن پرسین، سکاڵا پرسین
استحداث: نۆژەن کردن، نوێکردنەوە
– مُستحدَث: نۆژەن کراو
إستحصال: دەستگیر بوون
الاستحمام: گەرماوکردن
الاستجمام: پشوودان
إستخدام: بەکارهێنان، خستنەبەرکار، بەکاربردن
استخراج: دەرهێنان
استخراج المعادن: کانزا دەرهێنان
استخلاص: پوختەکردن
استدانة: قەرزکردن
استدعاء: بانگ کردن
استدلال: بەڵگەهێنانەوە، ڕێبەدێیی
استراحة: پشوودان، بێهن ڤەدان
استرخاء: خاو بوونەوە، خۆخاوکردنەوە
إسترداد: گێڕانەوە
استرقاق: بەکۆیلەکردن، کۆلەداری
– إسترقاق العبيد: بەکۆیلەکردنی بەندان
استسلام: مل دان، خۆبەدەستەوەدان
استشارة: ڕاوێژ، ڕاوێژپێکردن

– مستشار: ڕاوێژکار
– مستشير: ڕاوێژخواز
– الهيئة الاستشارية: دەستەی ڕاوێژکاریەتی
استضاءة: تیشکدانە سەر
استطلاع: سەراسۆکردن، سەرانسۆیی. لە فۆلکلۆردا هاتووە: «بەسمان لێ بگرە سەرانسۆی بانی».
استعادة: سەندنەوە
استعارة: خواستنەوە
استعراض: خۆنوواندن، خۆنوێنی
الاستعراض العسكري: خۆنواندنی سوپایی
استعراض العضلات: سنگ دەرپەڕاندن، بازوونیشاندان
استعراض الموضوع: بابەت خستنە بەرچاو، بەرچاوخستنی بابەت
الاستعطاف: دڵنەوایی
استعلامات: پرسگە
الاستعمار (للسياسة): وڵاتگری، ئیمپریالیزم
الاستعمار (للتعمير): ئاواکاری
استعمال: بەکارهێنان
الاستعلاء: خۆبەزلزانین
الاستعلاء القومي: خۆبەزلزانینی نەتەوەیی
استعلامات: پرسگە
استغراق (الوقت): خایاندن
استغلال (للانسان): ڕەنجخۆری، چەوساندنەوە
استغلال: وەسوودهێنان، وەبەرهێنان
استغلال اوقات الفراغ: وەسوودهێنانی کاتی بەتاڵایی
استغلال الارض: وەبەرهێنانی زەوی
استغلال الفرصة: بەهەل گرتن، بەهەل زانین
استغناء: واز لێ هێنان

استفتاء: ڕا پرسی
الاستفزاز: دەمارگرتن
استقالة: وازهێنان، دەست لێ کێشانەوە
استقامة: ڕێکی، ڕاستی
استقبال: پێشوازی، پێشبەری، بەپیرەوەچوون
استقرار: جێگیری، هێورین، هێوران، گیرسانەوە
استقطاب: جەوسەرگری
استقطاعات: دابڕین، دابڕکاری
استکشاف: دۆزینەوە
استلام: وەرگرتن
استمارة القبول: فۆرمی وەرگرتن
استماره النقل: فۆرمی گواستنەوە
استمرار: درێژەدان، *بەردەوامبوون*
استمرار: لەسەر ڕۆیشتن، بەردەوامی
الاستمرارية: بەردەوامیەتی
الاستنباط: هەڵهێنجان
استنتاج: ئەنجامگری
استنجاد: فریاخوازی
الاستنزاف: لەبەررۆیشتن
– حرب الاستنزاف: شەڕی لەبەررۆیشتن
الاستنساخ: لەبەرگرتنەوە، فۆتۆکۆپی
– جهاز الإستنساخ: ئامێری لەبەرگرتنەوە، (ئامێری فۆتۆکۆپی)
الإستنساخ البشري: لەبەرگرتنەوەی مرۆیی
استنشاق (الهواء): هەڵمژین
الاستنضاح: دەڵاندن
استهزاء: تیز، تەشەر، جەفەنگ، گاڵتە پێ کردن
استهلاك: بەکاربردن
استهلاك (للاقتصاد): بەرخۆری
استهلاك طاقة: بەکاربردنی وزە
– مواد مستهلكة: کەرستەی بەکارهاتوو
– مستهلك: بەکارهێن، بەکاربەر، بەرخۆر
إستهلال: سەرایی دانان
استواء: یەکسانی
استيراد: هاوردن
– مستورد: هاوردە. دەڵێ «ئەم دەسماڵە هاوردەی تەورێزە».
الاستيطان: بنەجێ بوون، نیشتەجێ بوون
الاستيطان الريفي: دێنشینی، *گوندنشینی*
الاستيطان المدني: باژێرنشینی
استيلاء: دەست بەسەرکردن، *دەست بەسەرگرتن*
أسد جبلي (وحشي): شێرە کێوی
الاسدية، الطلع: نێرەکی
الاسرار: نهێنیگەل، ڕاز و نهێنی
اسرة: خێزان
اسطوانة: لولەک، ئەستوون
اسطوانة التسجيل: قەوان
الاسطوانة الصلدة: کۆڵەکە، ئەستوون
الاسطوانة المجوفة: لوولە
الاسطورة: ئەفسانە
اسطول: کەشتیگەل
اسعاد: دڵخۆش کردن، شادکردن
أسعار الخصم: نرخی داشکاندن
الاسعار القياسية: نرخی پێوانەیی
الاسعاف: بەهانا چوون، فریاکەوتن
الاسعاف الفوري: بەهاناچوونی دەستبەجێ
اسعافات اولية: بەهاناچوونی بەرایی
الاسف: داخ، کەسەر
أسفنديان– نبات: کەوەت، کەڤۆت
اسفل: داوێن، *دامێن*، دەهمەن
اسفنج: ئیسفەنج، کەفی دەریا
الاسفين: پواز، نێرک

اسقاء: ئاودێری، ئاڤدان
الاسقربوط: ئەسکەرپۆت
إسکات: بێدەنگ کردن، دەمکوت کردن، کڕکردن
اسلاف: پێشینە، پێشینان
الاسلحة: چەک
أسلحة الدمار الشامل: چەکی وێرانکەری گشتی
الأسلحة الفتاكة: چەکی تووناکەر
الاسلحة النارية: چەکی ئاگردار، چەکی ئاگرین
اسلوب– لهجة: شێوازە، شێوەزار
الاسلوب الشرطي: شێوازەی مەرجی
اسلوب صيغة الامر: شێوازەی دەم فەرمانی
اسلوب الصيغة الانشائية: شێوازەی دەم داڕێژەیی
اسم: ناڤ، ناو
الاسم البسيط: ناوی سادە
الإسم الثـــلاثي: ناوی ســـێـــیـــینە، ناوی سێ پشتەکی، ناوی سیانی
اسم الجمع: ناوی کۆ
الاسم حسب الجنسية: ناو بەپێی رەگەز
الاسم العام: ناوی گشتی
اسم العلم: ناوی ناسەکی
اسم الفاعل: ناوی کارا
اسم الفعل: ناوی کار
الاسم المادي: ناوی مایەکی
الاسم المحايد: ناوی بێلایەن
الاسم المختصر: کورتەناو
الاسم المذكر: ناوی نێرەکی
الاسم المركب: ناوی لێکدراو
الاسم المستعار: ناوی خواستەنی
الاسم المشترك: ناوی ناوکۆ، ناوی هاوبەش
الاسم المشتق: ناوی داڕێژە، *داڕشتی*
الاسم المصغر: *نازناو*
الاسم المطول: درێژە ناوە
الاسم المعرف: ناوی ناسەنی
الاسم المعنوي: ناوی واتایی
الاسم المفرد: ناوی تاک
اسم المفعول: ناوی بەرکار
الاسم المؤنث: ناوی مێیەکی، ناوی مێ
الاسم النكرة: ناوی نەناسەکی
الأسم واللقب: ناو و پاشناو، ناو و ناسناو
الاسمال البالية: سیپاڵ، *کنجر*
أسمدة: پەین
الاسمدة الخضراء: سەوزە پەین
الاسمدة العضوية: پەینی زیندەڵ
الاسمدة الكيمياوية: پەینی کیمیایی
أسمر: سەوزە
الآسن: گەناو، گەنیو، *گەنی*
اسناد: پشتوانی
اسهال: زگچوون، پەلەفیرە، ڕەوانی
الاسهام: بەشداری، پشکداری
اسوداد: ڕەش داگەڕان، *ڕەشبوون*
الأسى: مخابن، خەم، پەژارە
أسر: دیلمان، *دیلی*
– سنوات الأسر: ساڵانی دیلمانی
– الوقوع في الأسر: دیلبوون
اسير: دیل
اشارة: هێما، نیشانە، دیاردی
– الاشارات السمعية: نیشانەی بیستەنی
– الاشارات الضوئية: نیشانەی ڕووناکی
اشارة التحذير: نیشانەی وریاداری
اشارة الى: نیشانە بە
إشاعة: هەڵبەستە، دەمگۆ، بانگەشە، بەندوباو
اشاعات مغرضة: دەمگۆی چەواشەکار

اشتراك: بەشداری، هاوبەشی
اشتراكية: سۆشیالیزم، هاوبەشایەتی
اشتقاق: داتاشین
اشتهار: ناودێربوون، ناودانەوە، ناڤدان
اشتیاق: تاسە، تامەزرۆیی
اشجار مثمرة: داری بەردار
اشراف: سەرپەرشتی
اشعاع: تیشک دان
اشعاع الحرارة: تیندانەوە، *تێندان*
اشعاع الضوء: تیشک دانەوە، *تیروژک دان*
اشعاعي: تیشکاوەری، *تیروژک*
أشعة الشمس: تیشکی تاو
أشعة الصدر: تیشکی سنگ
الاشعة فوق البنفسجية: تیشکی ژوور وەنەوشەیی
أشغال: داگیرکردن
أشقر: کەژ
اشمئزار: بێزکردنەوە
اشنة: کەوزە، کەڤز
الاصابة (بالامراض): ئەنگاوتن، *هنگاڤتن*
– المصاب: ئەنگاوتە، ئەنگواو. هێمن دەڵێ: «بۆچ نەناڵێ ئەم دڵە ئەنگاوتەیە». لە فۆلکلۆریشدا هاتووە: «دەڵێی هەلاڵەی بنکەن کراوی+ ئەتۆ عاشقی یان ئەنگواوی».
الاصابة بالشلل: شەپلەلێدان
اصابة الهدف: نیشان ئەنگاوتن، نیشان پێکان
الأصالة: ڕەسەنی
اصباغ شفافة: بۆیەی دیودەر
اصبع: پەنجە، ئەنگوست، تلی
اصدار: دەرچوواندن
اصدار– تصدیر: هەناردن، هەناردە

اصرار: سووربوون، پێکۆڵی
آصرة: بەند
اصطبل: پشتیر، گەوڕ، تەویلە، *ئەختەخانە، گۆڤ*
اصطدام (المصادمة): بەرەنگاربوون، تێک گیران
اصطفاف: ڕیز بوون
اصطلاح: زاراوە
اصطناعي– يدوي: دەستکرد، دەسکار، کر. «دەمەگری مەگری گریان گرانە+ ناردوومە بۆت بێ دەسکاری بانە».
اصطياف: هاوینەواری، کوێستان کردن
اصفر: زەرد، زەر
الأصل (باعث): ماکە، ماک. لە فۆلکلۆردا هاتووە: «ڕۆژهەلاتووە لە ماکێ+ دای لە سینگ و خەناوکێ»
أصل–جذر (للانسان): ڕەچەڵەک، *ڕەڤشت*
أصل (للموضوع): بنەڕەت، بناوان
اصول: ڕێوشوێن
أصولي– للفكر: بناوانگر
– الإسلام الأصولي: ئیسلامی بناوانگر
الأصولية: بناوانگریەتی
أصيل: ڕەچەڵەکدار، بەبناوان
اصيل: ڕەسەن، یەکڕەگ
– غير اصيل: ناڕەسەن
أصل– للشجرة: بنە
الاصلاح: چاککردن، دەستکاری کردن
الاصلاحات: چاکسازی
اصلاح ديني: چاکسازیی ئایینی
الاصلاح الزراعي: زەویسازی، چاکسازیی کشتوکاڵی، *چاکسازی چاندنێ*
أصلي: بنەچەیی، ڕەسەن
الاصلية: بنەڕەت

الاصوات الحادة: دەنگی زیل، دەنگی *تیژ*
الاصوات الغلیظة: دەنگی گڕ
الاصوات الموسیقیة: دەنگی مۆزیکی
الأصیص: ئینجانە
أصـــیل (وقت الغـــروب): زەردەی ڕۆئاوابوون، بوولێڵە، زەردەپەڕ
اضاءة: ڕووناککردنەوە، *ڕونکرن*
اضافة: خستنەپاڵ
اضافة الی: سەرەڕای، وێڕای
اضافي: سەربار
الاضبارة- الملف: فایل
الاضبارة الشخصیة: فایلی کەسایەتی
الاضـحـاك: هێنانە کـەنین، وەپێکەنین هاوردن، *کەناندن*
إضراب: مانگرتن
الاضراب عن الطعام: مان گرتن لە خواردن
- المضرب: مانگر
اضطراب: شێوان، پەشێوی، بشێونە
الاضطرار: ناچاربوون، بەناچاری
اضطهاد: چەوسانەوە
إضعاف: لاوازکردن
أضعاف: چەندجارە
اضغاط: پەستاوتن
الاضلاع: پەراسوو، لا
اضلاع كاذبة: گەندە پەراسوو، زڕەپەراسوو
الاضمحلال: لەناوچوون، پووکانەوە، *ژ ناڤ چوون*
اطار: چێوە
اطار (السیارة): تایە
الاطار (للصور): چوارچێوە، *چارچووڤە*
الاطار (الدائري): کەمە
اطاعة: گوێڕایەڵی، گوێداری
الاطالة: درێژەپێدان
اطراف (انحاء، ارجاء): سەرانسەر
الاطراف: پەل، پەلوپۆ
الاطراف الاربعة: چوارپەل، چوارلا
اطعام: دەرخواردان
اطفـاء: دامرکـاندنەوە، کـوژاندنەوە، *ڤـەمـراندن*، *تەمراندن*
اطفاء الحریق: ئاگرکوژێنی، *ڤەمراندن*، *تەمراندن*
الاطفال الصغار: کۆرپە
اطلاع: ئاگەداری
- للاطلاع: بۆ ئاگەداری
اطلاق: بەرهەڵداکردن
اطلاق العنان: ڕێشمە بەرهەڵدان
اطلاق سراح: ئازادکردن، بەرهەڵدان، ڕەها کردن. «دەڵێن: لەو بەندەم ڕەهاکە».
إطلاق النار: ئاگرهاوێژی
اطمئنان: دڵنیایی
الاظهار (تمثیل): نواندن
اعادة (كتاب رسمي): ناردنەوە
اعادة (للوظیفة): گێڕانەوە
اعادة التكریر: پاڵاوتنەوە، پارزنینەوە
اعادة تجمیع: لە نوێ کۆکردنەوە
اعادة النظر: چاو پێداگێڕانەوە
اعارة- استعارة: خواستنەوە
اعاشة: بژێوی
الاعاصیر البحریة: گێژەلووکەی زەریایی
اعاقة: تەگەرە یان کۆسپ تێ خستن
- معوقات: کۆسپە، تەگەرە
اعانة: پیتاک، باروبوو، کۆمەک
اعتبار- اهتمام: بایەخ، ڕەچاوکردن
اعتداء: دەسدرێژی

اعتدال (الهواء): هاوسان، فێنکی، *هینکاتی*
الاعتدال الخریفي: هاوسانیی پایزە
الاعتدال الربیعي: هاوسانیی بەهارە
الاعتدال الربیعي والخریفي: هاوسانیی بەهارە و پاییزە
الاعتدال الفصلي: هاوسانیی وەرزەکی
اعتذار: لێبوردن خوازی، *لێبورین*
– تقدیم الإعتذار: پێشکێش کردنی لێبوردن خوازی
اعتراض: بەرتەک، پێشبڕی
اعتراض الطریق: ڕێ لێ بڕینەوە
اعتراف: دان پێنان، پێ لێنان
الإعتراف بالدول: بەدەوڵەت ناسین
اعتقاد– عقیدة: باوەڕ
الاعتقاد– التصدیق: باوەڕکردن، بڕوا کردن، *باوەرکرن*
الاعتماد: پشت پێ بەستن، متمانە، بڕوا، *باوەری*
اعتماد (اعتماد مالي): پشتیوانە
الاعتماد علی النفس: بڕوابەخۆیی، متمانە بەخۆیی، پشت بەخۆبەستن
الاعتناء: بەتەنگەوە هاتن
اعتیادي: ئاسایی
الأعداد: ژمارەگەل
إعداد: ئامادەکردن
إعداد المعلمین: ئامادەکردنی فێرکاران
الاعدادیة: ئامادەیی
اعراض – علامة: نیشانە
اعراض المرض: نیشانەی نەخۆشی
اعشاب: گژوگیا
اعصاب: دەمارگەل
اعصاب دماغیة: دەمارگەلی مێشکی
اعصاب شوکیة: دەمارگەلی دڕکاوی
اعصاب مختلطة: دەمارگەلی تێکەڵە
اعصاب مرکزیة: دەمارگەلی ناوەندی
الاعصاب والحس: دەمار و هەست
اعصار: زریان، بابەلیسک، باهۆز، گەردەلوول
الاعظم: مەزنترین
الإعلام: ڕاگەیاندن
اعلام: ئاگەداری
اعلام الزوجیة: بەڵگەی خێزانداری
اعلان – نشر: جاڕدان، جاڕکێشان
اعلان الحرب: شەڕ جاڕدان
إعمار– بناء: ئاوەدان کردنەوە، *ئاڤەدانکرن*
أعماق: بنەبان، تەپان، *کویراتی*
أعماق البحار: تەپانی زەریا، قووڵاییی زەریا
الاعمال الارادیة: کردارگەلی خۆکردەیی
الاعمال اللاارادیة: کردارگەلی خۆنەکردەیی
الاعمال الحیویة: کردارگەلی زیندەکی
اعمال یدویة: کاری دەستەکی، کاری دەستی
أعمدة: کۆڵەکە، ستوون
– أعمدة الدخان: کۆڵەکەی دووکەڵ
اعمی: کوێر، کۆرە
أعوج: چەوت، چەوێڵ، *خوار*
إعیاء: ماندووەتی، شەکەتی، *وەستیان*
اغاثة: بەفریاهاتن
اغتراب: ئاوەکی بوون، نامۆبوون
الاغتیال: ڕەشەکوژی
اغذیة محفوظة: خواردەمەنیی پاراستە
الاغراض ج– غرض: نیاز
الاغراض السلمیة: نیازی ئاشتیخوازانە
إغراق: نوقوم کردن
اغراق السوق: بازار پڕکردن

اغطية: پۆشەک، پێخەف
اغلاق: داخستن، پێوەدان
اغلفة ج- غلاف: بەرگ
إغماء: بوورانەوە، لەهۆش چوون، *بێ هشی*
اغنية: گۆرانی، ستران
افتراض- فرضية: گریمانە
الافتراض-افتراضا: گریان
افراد- فرد: تاک
الافراز: ڕژاندن، دەردان
افراز- افرازات: دەرهاوێشتە، ڕژاوە
افراغ: بەتاڵ کردن
الافرشة: ڕایەخ
الافزاع: تۆقاندن
افشاء: بڵاوکردنەوە
افشاء السر: بڵاوکردنەوەی نهێنی، درکاندنی ڕاز
افعال انعكاسية: کاری بەرتەکەکی، *پەرچە کردار*
افعال آلية: کاری ئامێرەکی
افعال عصبية: کاری دەمارەکی
افق: ئاسۆ، ئاسۆگە
افقي: ئاسۆیی، پۆیی
افلات: دەربازبوون، *ڤەرەسیان*
افلاس: مایەپووچی، نابووتی
افلاك- فلك: چەرخ
آفة: پەتا
إفهام: تێگەیاندن
الأفول: ئاوابوون
الأفين- المأفون: لاژگ، گەمژە، گەمژەڵ
اقامة: دامەزراندن، نیشتەجێیی
الاقاويل: قسەوقسەلۆک، واتەوات، گۆتەگۆت
الاقتاد: دڕک، ستری، دڕکەزی
اقتباس: لێ وەرگرتن
اقتراح: پێشنیاز
الاقتراع السري: دەنگدانی نهێنی
اقتران: جووت بوون
اقتصاد: ئابوور
اقتصادي: ئابووری
- الوضع الإقتصادي: باری ئابووری
إقتصادي- اقتصاد في النفقات: بگر، دەست پێوەگر، بەئابوور. دەڵێ: «ئافرەتێکی بگرە» یان «بەئابووربە».
الاقتصاد المنزلي: ماڵداری
اقتلاع: هەڵکێشان، دەرکێشان
الإقتلاع من الجذور: لە ڕەگەوە هەڵکێشان
أقذار: پەڵە
إقرار (اعتراف): دان پێنان، سەلماندن
إقرار (تثبيت): چەسپاندن، بڕیاردان
أقراص- قرص: ساپ
أقراص الكترونية: ساپی ئەلیکترۆنی
الاقسام الادارية: بەشەگەلی کارگێڕی
أقصى: ئەوپەڕ، دوورترین
الأقط: کەشک
اقطار (ج) قطر: وڵات
اقطاعي: دەرەبەگ، فیۆداڵ
اقليم: هەرێم
- النزعة الاقليمية: خولیای هەرێم پەروەری
الاقلية: کەمینە، کەمایەتی
أقمار إصطناعية: مانگی دەسکار
أقمشة: کوتاڵ
الاقناع: قایل کردن، بڕوا پێ هێنان
اقنعة- قناع: دەمامک، دەمبێن. لەسەرکێشی (دەسبێن).
اقنعة الغازات السامة: دەمامکی یان دەمبێنی

گازی ژاراوی
اقوال مأثورة: پەندی پێشینان
اکتتاب: باربوو، پیتاک
اکتساء: پۆشین
اکتساب: پەیداکردن
اکتساب المهارة: پەیداکردنی لێزانی
الاکتساح: ڕامالّین
اکتشاف: دۆزینەوە
الاکتشافات الاثریة: دۆزینەوەی شوێنەواری
اکثر- ازید: پتر، زۆرتر
الاکثر تعقیداً: ئالۆزتر
الاکثر شدة: توندتر
الاکثریة: زۆربە، زۆرینە
اکرامیة: ڕێزانە، بەخشیش
الاکراه: بەنادڵی، بەزۆری
اگزیما: بیرۆ، بیرۆڤ
أکسیر الحیاة: مایەی ژیان، ئیکسیری ژیان.
آکلات الاعشاب: گیاخۆر
الأکلة: نەخۆشیی خۆرە
اکمال (في الدرس): دواکەوتن
- مکمل: دواکەوتە
الاکمال- تکمیل: تەواو کردن
الاکمة: گردۆلکە
الاکیاس المائیة: توورەگەی ئاوی
الاکیاس الهوائیة: توورەگەی هەوایی
الآل (السراب): تراویلکە، سەراو
الآلات الغشائیة: ئامێری چەرمەکی
الالاف: هەزاران
الالاف المؤلفة: هەزاران هەزار
ألبان: شیرەمەنی، سپیایی، *سپیاتی*
الالتئام: سارێژبوون
التباس: بەهەڵەداچوون
الالتجاء: پەنابۆبردن
إلتحاق (بالوظیفة): چوونەسەرکار
التزام: دەربەستی
- ملتزم: دەربەست
- غیر ملتزم: بەیدەست، نا دەربەست
التصاق: پێوەلکان، لکان
التفاتة: ئاوڕدانەوە
إلتماس: هیواخوازی، تکاکاری
التقاط: هەڵگرتنەوە
التقاء: ژوان، بەیەک گەیشتن
التهاب: هەڵایسان، گڕگرتن
التهاب-في الطب: هەوکردن، *هەودان*
الالتهاب الرئوي: هەوکردنی سییەکی
التهاب القصبات: هەوکردنی لوولەی هەوایی
إلتهام: لرفاندن، لووشدان
التواءات: پێچاوپێچ، پێچەڵپێچ
التواء: چەمانەوە، نووشتانەوە، *چەمیان*
ألتواءات (جغرافیة): گەوە، پێچەک
الالحاح: پێکۆڵی، سووربوون
الحاق (الحاقاً بکتابنا): دوا بەدوا
الذي: ئەوەی
الالزام: دەربەست کردن
الصاق (للتهمة): پێوە لکاندن
الالعاب الناریة: گەمەی ئاگراوی، گەمەی ئاگرین
الغاء (فسخ): هەڵوەشاندنەوە
الالغاز: مەتەڵ
الف: هەزار
الفات نظر: سەرنج ڕاکێشان
الألفة: هۆگری، دەستەمۆیی، دەساژۆیی
الألق: بریسکانەوە

الالقاب: ناسناو، پاشناو
الالقاب المذمومة: ناتۆره
الم- اوجاع: ئێش، ژان
ألماس، ماس: ئەڵماس
الالمام: ئاگەداری
المنيوم: ئەلەمنیۆم، فافۆن
آلة: ئامێر
آلة الترشيح (في المختبر): پاڵوێنه، پارزينک
آلة التشريح: ئامێری توێکاری
آلة التصوير: ئامێری وێنەگری، کاميرا
آلة حادلة: ئامێری پەستێنەک، باگردێن
الآلة الحاسبة: ئامێری ژمێر
آلة الخضاض: ئامێری ژەنین، ژەنەک
آلة صنع الثلج: ئامێری سەهۆڵسازی
آلة الضرب: ئامێری لێدان، کوتەک
آلة العصر: ئامێری گوشین
- العصارة: گوشەک
آلة غشائية: ئامێری پەردەیی
آلة الفراز: ئامێری دەردەر
آلة موسيقية: ئامێری مۆزيکی
آلة هوائية: ئامێری هەوایی
آلة وترية: ئامێری ژێیی
آلي: ئامێرەکی
آلية العمل: ئامێرایەتیی کار
الالهيات- اللاهوت: زانستی خواناسی
الواح طينية: تاتی گڵێنه
الياف: ریشاڵ
الالياف الصناعية: ریشاڵی دەستکار
الالياف العصبية: ریشاڵ دەمارەکی
الالياف العضلية: ریشاڵی ماسولکەیی
الالياف النباتية: ریشاڵی رووەکی

اليف: هۆگر، دەستەمۆ، ماڵی
ام اربع وأربعون: هەزار پێ، *زيڤ زيڤه*
الأمارة: نيشانه
إمارة: ميرنشينی، ميرەکايەتی
اماطة اللثام- تعرية: داماڵين
الاماكن المجهولة: شوێنی کەسنەزان
الاماكن المهجورة: وێرانه، کەلاوه
الأمام: نوا، پێش
الإمام: پێشنوێژ، بەرنوێژ، پێشەوا
أمان: دڵنيايی
الأمانة (الايداع): راسپارده
امبراطور: ئيمپراتۆر
امبرياليزم: ئيمپرياليزم
الامتحان- الاختبار، التجربة: تاقيکردنەوه
امتحان نصف السنة: تاقيکردنەوەی نيوەی ساڵ
الامتحان النهائي: تاقيکردنەوەی کۆتايی
الامتحان الوزاري: تاقيکردنەوەی بەکالۆريا
امتداد: درێژبوونەوه، درێژه
امتصاص: مژين
إمتناع: خۆپارێزی
- الإمتناع عن التصويت: خۆپارێزی له دەنگدان
امتياز: مافی تايبەتی، سەرپشکايەتی
آمر: فەرمانده
آمر الحامية: فەرماندەی مۆڵگه
آمر الحضيرة: فەرماندەی دەسته
آمر السرية: فەرماندەی لق
آمر الفصيل: فەرماندەی پەل
آمر الفوج: فەرماندەی بەتاليۆن
آمر اللواء: فەرماندەی ليوا، يان هێز
آمر المقر: فەرماندەی بنکه
أمر: فەرمان

أمر اداري: فەرمانی کارگێڕی
أمر رسمي: فەرمانی میری
أمر وزاري: فەرمانی وەزارەتی
إمرار: تێپەڕاندن
امرار القضية: تێپەڕاندنی کێشە
الامراض الانتقالية: نەخۆشیی پەتا
الامراض السارية: نەخۆشیی گیرۆ
الامراض المعدية: نەخۆشیی درم
إمرأة: ئافرەت، ژن
إمساك: گیراوی
امطار: باران
الامطار التضاريسية: هەڵەتەباران
الامطار الغزيرة: ڕێژنەباران
امعاء: ڕیخۆڵە، *ریڤیک*
الامعاء الدقيقة: ڕیخۆڵە باریکە، *ریڤیکا زراف*
الامعاء الغليظة: ڕیخۆڵە ئەستوورە، *ریڤیکا ستور*
امكانيه: شیان، لوان
امل: هیڤی، هیوا
إملاء (قواعد الاملاء): ڕێنووس
إملاء الشروط: مەرج سەپاندن
الأملاح: شۆرەکات، خوێواوک
املاح معدنية: خوێی کانزایی
أملس: لووس
املط، املس: کۆسە، لووسکە
الأمم المتحدة: نەتەوە یەکگرتووەکان
أمن: ئاسایش
– مؤسسات أمنية: داوودەزگای ئاسایش
أمّة: نەتەوە
امهال: هەل پێدان
الامواج: شەپۆڵ، پێل، *سیپەل*
الامواج فوق الصوتية: شەپۆلی سەروو دەنگ
الامواج المنعكسة: شەپۆلی بەرتەکدەر
الاموال: ماڵ
الاموال المنقولة: زیندەماڵ
الاموال غير المنقولة: مردەماڵ
الامور الجارية: کاروباری ڕۆییو، *کاروباریٚ رەوان*
– تصريف الامور الجارية: بەڕێکردنی کاروباری ڕۆییو
الامومة: دایکایەتی
الامومة والطفولة: دایکایەتی و ساوایەتی
أمي: نەخوێندەوار
– الامية: نەخوێندەواری
الامير: میر
امير الامراء: میری میران
امير المؤمنين: میری باوەڕداران
الامين: ڕازدار
أمين الصندوق: خەزنەدار
الآن: نهۆ، ئێستە، *نۆکە*
أنا: من، ئەز
اناء: دەفر، ئامان، هیربار
– اناء فخاري: دەفری گڵێنە
الآناء: دەمکات
آناء الليل: دەمکاتی شەوێ
انابيب– انبوب: لوولەک
اناطة: پێ سپاردن
الأناقة: ڕێکپۆشی، تەڕپۆشی
الأناني: خۆپەرست
الانانية: خۆپەرستی
الاناة: لەسەرخۆیی
الانبات: ڕوواندن، چەکەرەکردن
انبات ارضي: چەکەرەکردنی زەوییەکی، ڕووانی

زەوییەکی
انبـات هوائي: ڕووانی هەوایی، چەکـەرەکـردنی هەوایی
انبساط: پان بوونەوە
انبعاث: ژیانەوە، *ڤەژاندن*
انبعاج: قۆپانەوە
انبوب: لوولەک
انبوب التوصيل: لوولەکی گەیاندن
انبوب جانبي: لوولەکی لاتەنیشت
انبوب الحفر: لوولەکی هەڵکەندن، کولان
انبوب رئيسي: لوولەکی سەرەکی
انت: تە، تۆ
انتاج: بەبەرهەم هێنان، بەرهەم، بەروبووم
الانتاج السنوي: بەرهەمی ساڵانە
انتباه: وریایی، *هشیاری*
انتحار: خۆکوژی
انتخاب: هەڵبژاردن
انتداب (نظام): راسپێری
– منتدب: راسپێر
انتزاع: لێ کردنەوە، لێ سەندن
انتشار: بڵاوبوونەوە، تەشەنەکردن، *بەلاڤبوون*
انتشال: دەرکێشان
انتظار: چاوەنواڕی، چاڤنێڕی
الانتعاش: بووژانەوە، گەشانەوە
انتفاء: نەمان
انتفاخ: باکردن، ئاوسان، *پفبوون*
انتفاضة: ڕاپەڕین، سەرهەڵدان
انتقاء: چنینەوە، دەسبژێرکردن
انتقال: گواستنەوە
إنتقال الصوت: گواستنەوەی دەنگ
انتقال الحرارة: گواستنەوەی گەرمی
انتقام: تۆڵە
أنتم: هوون، ئێوە
إنتماء: هاتنەپاڵ
إنتهاء: بڕانەوە، تەواو بوون، بەکۆتاهاتن
انتهاء الخدمة: بەکۆتاهاتنی خزمەت
الانتهازي: هەلپەرست، لە هەلگەڕ
انتهاك: پێشێل کردن، بەزاندن
انتـهـاك الحـدود الدوليـة: بەزاندنی سنووری نێودەوڵەتی
انتهـاك حقـوق الانسـان: پێشـێل کـردنی مـافی مرۆڤ
أنثوي: مێیانە
انثى: مێیینە، مێچکە
انج: گرێ
الانجاز: بەجێهێنان
انجراف: ڕامالێن
انجماد: بەستن
أنحاء–ناحية: ناوچە
انحباس: گیران، گیربوون
انحدار: نشێو، لێژی، لێژبوونەوە
انحدار الارض: لێژیی زەوی، نشێوی
انحراف: لادان
الانحراف الربيعي: لادانی بەهارە
الانحراف المتوسط: لادانی ناوەندی
الانحراف المعياري: لادانی پێوانەیی
الانحراف المغناطيسي: لادانی موگناتیسی
انحصار: گیربوون
انحلال: داڕزان، داهێزران
انحلال (للدول): هەڵوەشان
انحـلال العـضـلات: داوەشـانی مـاسـوولکە، پووکانەوەی ماسوولکە

